وتاری بیست

زنجیرە وتاری (شیرک و شیرکی گوێڕایەڵیکردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## جێگەکانی هەڵگەڕانەوە لە چوونە پەرلەمان-٢-

## مواطن الرّدة في دخول البرلمان -٢-

شێخی موجاهید

أبو علي الأنباري

تقبله الله

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوجەجە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت، لە پاشاندا:

دوێنێ قسەمان کرد دەربارەی ئەو جێگەیانەی پاڵێوراوەکان دەچنە نێویەوە بۆ چوونە پەرلەمان و ئەوانەشی کار دەکەن لە حکومەتە تاغوتییەکان، وە وتمان جێگەی یەکەم کە ئەو حیزبانە جا بەناو ئیسلامییەکان بن یان جگە لەوان بن، ئەوانە هەموویان لە دەستپێکدا پێویستە دەستور پەسەند بکەن، وە باسی هەندێك وردەکارییەکەمان کرد و باسی وتەکانی زانایانمان کرد، وە باسی وتەی ئیبن تەیمیەمان کرد لە بابەتی حەڵاڵ کردن و وتمان ئەوانە حوکمەکەیان حەڵاڵ کردووە کاتێك وتویانە بۆ دەستور بەڵێ، وە کاتێك هانی خەڵکیان داوە بڵێن بەڵێ، وە کاتێك سوێندیان بە خوای بەرز و گەورە خواردووە کە کار بکەن بەم دەستورە و سەرپێچی نەکەن، وە هەروەها کاتێك لێپرسینەوە دەکەن لەگەڵ ئەو کەسەی سەرپێچی دەستور دەکات -یەکێك لە وەزیرەکان یاخود یەکێك لە وەزارەتەکان-.

باسەکەمان تەواو دەکەین لەبارەی جێگەی دووەم کە پێویستە ئەو حیزبانەی بەشداری دەکەن لە دەسەڵات بچنە نێویەوە، وە ئەم جێگەیەش ناوی دەنێم بە: جێگەی باوەڕبوون بە فرە حیزبی، وشەی باوەڕبوون ئەمە زاراوەی من نیە بەڵکو ئەوان بەم شێوەیە بەکاریدێنن، دەڵێن: باوەڕمان هەیە بە فرە حیزبی، وە بە هەمان شێوە لە ڕووی گوزراشتەوە دەڵێن: باوەڕبوون بە فرە حیزبی.

ئەم بابەتە تەشریعدانەری عێراقی دەقی لەسەری نوسیوە لە دەستور، وە ماددەی ٣٧ پێکهاتووە لەمە دەڵێت: "ئازادی دامەزراندنی کۆمەڵە و حیزبە سیاسییەکان یان چوونە پاڵیان دەستەبەر کراوە، وە ئەمەش ڕێکخراوە بە قانون" ئەمە دەقی ماددەی ٣٧ لە قانونی عێراقی، واتای ئەم قانونە کاتێك قانون دەڵێت: ئازادیتان بۆ هەیە لە دامەزراندنی کۆمەڵە و حیزبی سیاسی و ئازادیت بۆ هەیە بچیتە پاڵ هەر حیزبێك لەو حیزبانەی دانی پێدانراوە لە لایەن قانون، پاشان دەڵێت: دەستەبەر کراوە، وە مانای (مكفولة) واتە دەوڵەت مۆڵەتدان بە دروستکردنی ئەو حیزبانە لەخۆدەگرێت و دەستەبەر دەکات و

پاشانیش پاراستنی ئەو حیزبانە، تەنها ئەو مەرجەی دایانناوە دەڵێت: ئەمەش ڕێکدەخرێت بە قانون، واتە قانون مەرجەکان دادەنێت بۆ ئەو حیزبانەی پێکدەهێنرێت -ئەو ڕێکخەرە دەستوورییە داواکراوانە چیین لەو حیزبانە بۆ ئەوەی مافی هەبوونیان هەبێت-

کاتێك ئەم بنچینەیەت زانی، ئازادی لێرەدا واتە مۆڵەتدان، کاتێك کەسێك لێت دەپرسێت: ئەو شتە بکەم یان نا؟ دەڵێیت: تۆ ئازادی، واتە: بۆت هەیە ئەم کارە بکەی و بۆشت هەیە ئەم کارە نەکەیت، بەڵام ئەگەر کردت -ئەگەر پێت وت تۆ ئازادی- بەڵام ئەگەر کردت ئەوا من ئەوە لە ئەستۆ دەگرم کە خراپەت بەرامبەر نەکرێت، کەوایە تۆ مۆڵەتت دا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، جا قانون ڕێگەت دەدات بە دروستکردنی حیزبەکان و دروستکردنی کۆمەڵەکان و هەروەها ڕێگەت دەدات بە چوونە پاڵ ئەو حیزبانە و ئەو کۆمەڵانە ئەگەرنا چ مانایەك هەیە بۆ ئەم ئازادییە لەم ماددەیە لە دەستور.

کەوایە بەگوێرەی ئەم ماددەیە پوختەیەکمان دەست دەکەوێت جا دەڵێین: ئەوەی باوەڕی هێناوە بە فرە حیزبی ئەوا ڕێگەی داوە بە نەسارا کە حیزبیان هەبێت، ئاشوری، کلدانی، نەسرانی، ئەو ناوانەی هەن لەم وڵاتە، هەروەها ڕێگەی داوە بە ئێزیدی کە حیزبێك پێکبهێنێت بەپێی دینەکەی و بەپێی پەرستراوەکانی، ئازادیت بۆ هەیە: واتە ڕێگەت پێدەدەم بۆ ئەمە و ئەگەر ئەنجامیشت دا ئەوا من پاراستنت لەئەستۆ دەگرم و بوونت لەئەستۆ دەگرم، هەروەها ئەم ماددەیە -باوەڕبوون بە فرە حیزبی- بەگوێرەی ئەم ماددەیە مۆڵەت دەدات بە شیوعی کە حیزبی هەبێت، وە مۆڵەت دەدات بە عەلمانی حیزبی هەبێت، ئەمە شتێکە دوو عاقڵ ناکۆك نین لەسەری، دوو لە خاوەن ژیرییەکان ناکۆك نابن لەم بابەتە، ئەمەش دەقی دەستوری عێراقی بوو جا بەپێی ئەم ماددەیە بینیتان لە ٢٠٠٣ ژمارەی ئەو بارەگایانەی هەبوون لە شاری موصل چەند بوون، هەروەها لە تەواوی شارەکانی ئەهلی سوننە لە چوارچێوەی ئەو پارێزگایانە، هەندێك بارەگای ڕافیضە هەبوون، ڕاستەوخۆ دوای ڕووخانی ڕژێمەکە دەستیان کرد بە زیندووکردنەوەی هەندێك لە ڕێوڕەسمەکانیان، کە بە چاوی خۆم بینیم لە ٢٠٠٣ لە سەرەتای موحەڕەم چۆن کاروانەکان لە (الرّشيدية) ئاڵایە ڕەشەکان و ئاڵایە سوورەکانیان هەڵدەگرت کە لەسەریان نووسرابوو "يا أبا الفضل عباس"، و "يا أبا عبد الله الحسين"، وە حوسەینیەیان هەبوو لە (الفيصلية) کە دەستی بە چاڵاکی کرد، وە ویستیان حوسەینیەیەکی تر دروست بکەن لە ناوچەیەکی تر، هیچ ڕافیضیێك نیە لەناو شارەکە بەڵام هەندێك تاکیان هەبوو لە دەوروبەر جا هاتبوونە نێو شارەکە، وە لە ٢٠٠٤ بوو ئەوەی لەبیرم بێت یان ٢٠٠٥ بوو خۆیان ئامادە کرد بۆ دەرچوون بە کەژاوەکان لەناو شاری موصل لەناو ئەو حوسەینیەی لە (الفيصلية) هەبوو، بەڵام یەکێك لە گەنجەکان -داواکارم لە الله تعالى لە پلە بەرزەکانی بەهەشت وەریبگرێت- خۆی کرد بەنێویاندا جا کۆتاییان بەم کردەوەیە بوو، بۆیە ئیتر دوای

ئەمە هیچ ڕافیضییێك بیری لەوە نەکردەوە بە پیادە بڕوات لە شەقامەکانی ئەهلی سوننە لەو شارانە پاشانیش هاوار بکات "یا عباس ویا حسین ویا ثارات" و ئەو جۆرە شتانە، بۆیە ئەگەر الله تعالی ئەو گەنجانەی نەڕەخساندبوایە، والله بارەگاکانی حیزبی شیوعیتان دەبینی لە ناوتان، والله بارەگاکانی ڕافیضەتان دەبینی لە ناوتان، وە دەتانبینی خاوەن مێزەرە ڕەشەکان چییان دەکرد بە خەڵکی ئەم شارە، وە دەتانبینی و دەتانبینی و ...، بەڵام الله تعالی ئەم خراپەیەی دوورخستەوە لە خەڵکی ئەو پارێزگایانە کە لەوانەیە بەهۆی خێر و چاکەیەك کە تیایاندا بێت -والله حسیبهم- جا الله تعالی ئەو خراپە و زیانانەی لێیان دوورخستەوە.

جا واتای باوەڕبوون بە فرە حیزبی بەپێی ماددە عێراقیەکە، واتە ئەو حیزبانە مۆڵەت دەدەن بە کەسانی تر بۆ دروستکردنی حیزب، وە تەنها باسی ئەوانەم کرد کە ناکۆك نین لەبارەی کوفرەکەیان، باسی نەساڕام کرد و باسی ئێزیدیم کرد و باسی شیوعیم کرد و باسی عەلمانیم کرد، ئەوانە دوو موسڵمان ناکۆك نین لەبارەی کوفرەکانیان، هەموو ئەوانە بۆیان هەیە حیزبیان هەبێت.

وە وتەی ئەوانەی مۆڵەت دەدەن بەمە بۆت دەگوازمەوە:

یەکەم: ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ ڕۆژنامەی "الشوری" کە لەناو شاری موصل دەردەچوو، لە سەرەتای ڕووخانی ڕژێم -ڕەش و سپی- لەم ڕۆژنامەیەدا ژمارەیەك دیدار هەبوو لەگەڵ "إدریس حاج داود" کە بەرپرسی حیزبی عێراقی بوو لەم شارە، گەورە ڕۆژنامەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجام دەدا و ئەو کابرایەش وای دەزانی پلە و پایەیەکی هەیە، لەنێو ئەو پرسیارانەی ئاڕاستەی دەکرا: ئایا باوەڕتان بە فرە حیزبی هەیە؟ هەمیشە وەڵامەکە ئەوە بوو: باوەڕمان بە فرە حیزبی هەیە، ئەمە سەرێکە کە بانگەشەی موسڵمانبوون دەکات!

حیزبێکی تر هەبوو لە سوریا -حیزبی ئیخوان- سەرت سوڕنەمێنێت لە قسەکانم کاتێك هەمیشە باسی ئەوانە دەکەم، هەر حیزبێك بێت لە هەر لایەنێکەوە بێت ئەوا ئەم قسانە دەیگرێتەوە، بەڵام جەختکردنەوەم لەسەر ئەوانە لەو لایەنەوەیە کە ئەوان بانگەشەی خۆدانە پاڵ ئیسلام دەکەن، حیزبی سوری -حیزبی ئیخوانی سوریا- پیاوێك نازناوی "البیانوني" بوو لە شاری بیانون لە سوریا لە دێهاتی حەلەب، ئەم کابرایە کۆنگرەیەکیان لەگەڵ بەستا لە کەناڵی "الجزیرة مباشر"، وە دوای ئەوە بەیاننامەیەکیان خوێندەوە کە ئامادەیان کردبوو دەیانەوێت شێوازی حکومەتەکە چۆن بێت دوای ڕووخانی بەشار -ئەو نوصەیرییە- جا لە سەرەتای پەیماننامەکە وتیان: "وە ئەم پەیماننامەیە پێشکەشی دەکەین لەبەردەم الله و لەبەردەم گەل -بە پیتی العطف (و) - پاشان وتی لە چوارچێوەی ئەو بەندانەش وتی دەمانەوێت -واتە دوای ڕووخانی بەشار- دەمانەوێت دەوڵەتێکی دیموکراسی فرە حیزبی

دەستاودەست بێت" واتە ئەو سەرانەیان کە ئەو حیزبانە دەهێننە کایەوە باوەڕیان بە فرە حیزبی هەیە هەر کەسێك بیەوێت حیزبێك پێکبهێنێت لە هەر دینێك بێت لە هەر لایەنێك بێت لەسەر هەر بیروباوەڕێك بێت لەسەر هەر فکرێك بێت گرنگ نیە، بۆچی؟ چونکە قانون ڕێگە بەمە دەدات، وە لە دیموکراسیدایە کە پێویستە فرە حیزبی هەبێت ئەگەرنا چ مانایەك بۆ دیموکراسی دەمێنێتەوە ئەگەر دەوڵەت لەسەر یەك حیزب دابمەزرێت، ناکرێت.

هەروەها "فرید عبد الخالق" ئەمەش لە سەرانی ئیخوانی میصرە لە میصر دەڵێت کە ئەم قسەیە لە "الحصاد المرّ" وتراوە و سەرچاوەکەشی لە گۆڤاری (المصور)ـە ژمارە ٣٢١٧ ، ٢٩ -ڕەمەزان- ١٤٠٦ بەرامبەر ١٩٨٦م، دەڵێت "ئیسلام دژی دامەزراندنی حیزبی سیاسی نیە، وە دژی دیموکراسیش نیە بەڵکو کرۆکی دیموکراسی لە ناوەڕۆکی ئیسلامدایە"، ئەمە قسەکەی بوو!

کەسێکی تر بەناوی "أحمد سیف الإسلام" -سەرنجی ناوەکان بدە- کە خاوەنی چەقۆیەکیش نیە من دڵنیام، (أحمد سیف الإسلام) ئایا دەزانی کوڕی کێیە؟ کوڕی حەسەن بەننایە، (أحمد سیف الإسلام) لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵیدا لە گۆڤاری (المجتمع) ژمارە ٨٨٤، ٩ -جومادی سەرەتا- ١٤٠٨ بەرامبەر ١٩٨٧م، پرسیاری لێکرا لە لایەن گۆڤارەکەوە: بۆچوونتان چۆنە و هەڵوێستتان چییە لەبارەی مافی پێکهێنانی حیزب بۆ هەموو ئاڕاستەکان و لایەنەکان و لەنێویشیاندا شیوعییەکان؟ -پرسیارێکی ڕاشکاو و ڕوونە- ئەویش وەڵامی دایەوە -سیف الإسلام سەرنج بدە چۆن وەڵامی دایەوە-، وتی: "ئەم مافەیان بۆ هەیە"! ، کاتێك وتمان قانون ڕێگە بەوانە دەدات حیزب پێکبهێنن، ئەمانە لێدوانەکانی سەرانیانە کە ئەوان ڕێگە دەدەن بە شیوعییەکان بەوەی مافیان هەبێت لە دروستکردنی حیزب لەناو وڵاتانی موسڵمانان، وتی: ئەم مافەیان بۆ هەیە، وە ئیسلام ئینسان ناچار ناکات لەسەر پابەندبوون بە بیروباوەڕ (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ)"، سەیربکە چی دروست دەبێت لەم قسەیە، کاتێك مۆڵەت دەدەن و باوەڕیشیان بە فرە حیزبی هەیە ئەوا لەسەر ئەم باوەڕە و لەسەر ئەم مۆڵەتدانە ئەمانە دروست دەبێت:

یەکەم: بەوەی لەسەر دینەکەی بمێنێتەوە و بیروباوەڕەکەی ئاشکرا بکات، ئەگەرنا مانای ئەوە چییە کە تۆ مافت هەیە حیزبێك پێکبهێنیت و لە کاتێکدا جیابوویتەوە لە بیروباوەڕەکەت، نەسڕانی مافی هەیە حیزبێك پێکبهێنێت کاتێك مۆڵەتی درا، ئەمە واتە ئەو بانگەواز دەکات بۆ بیروباوەڕەکەی، ئێزیدی هەتاوەکو مافی ئەوەی هەبێت حیزبێك دروست بکات، کەوایە بۆی هەیە بیروباوەڕەکەی ئاشکرا بکات، شیوعی و عەلمانی قانون و ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە فرە حیزبی مۆڵەتیان پێدەدەن کە بانگەوازەکەیان بە ئاشکرا ڕابگەیەنن، ئەمە دروست دەبێت لە باوەڕبوون بە بنەمای یاخود ئازادی فرە حیزبی.

دووەم شت: هەروەها ئەم باوەڕە ڕێگەیان پێدەدات ببن بە خاوەنی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، کەوایە

بیروباوەڕەکەی ئاشکرا دەکات -نایشارێتەوە- وە ببێتە خاوەنی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بە هەموو پێکهاتە و جۆرەکانیەوە: خوێنراو و بینراو و بیستراو، وە لەسەر ئەم باوەڕبوونە بە فرە حیزبی ئەوەی لێدروست دەبێت کە مۆڵەت بەوانە بدرێت بۆ بانگەواز کردن بۆ بیروباوەڕەکەیان و بۆ دینەکەیان، بە هەمان شێوە ئەوەشی لێدەکەوێتەوە کە حوکمی وڵات بکەن ئەگەر زۆرترین دەنگیان هێنا و ئەگەریش لە خوار ئەمە بوون ئەوا مافی ئەوەیان هەیە بەشداری بکەن لە حوکم.

باوەڕبوون بە بنەمای فرە حیزبی ئەم چوار بابەتەی لێدروست دەبێت، بیروباوەڕەکەی ئاشکرا بکات و ببێتە خاوەنی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و بانگەواز بکات بۆ بیروباوەڕەکەی و بەشداریش بکات لە هەڵبژاردنەکان، جا ئەگەر زۆرترین دەنگی هێنا ئەوا حوکمی وڵات دەکات، باشە، نەسارِا زۆرینە بێنن، بیروباوەڕییان ڕابگەیەنن لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و بانگەواز بکەن بۆ نەسڕانیەت و خەڵکیش بڕوایان پێبکەن و لە هەڵبژاردنەکان براوە بوون و گەیشتنە حوکم، شیوعییەکان بیروباوەڕییان ئاشکرا کرد -خوا نیە و ژیانیش ماددەیە- پاشان دوای ئەمە لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بانگەوازیان کرد بۆ ئەم بیروباوەڕە و خەڵکیش بەدەمیانەوە هاتن و وەڵامیان دانەوە، وە زۆرترین دەنگیان هێنا و گەیشتنە پەرلەمان، ئەوا حوکم بۆ ئەوانە!

ئەوەی باوەڕی بە فرە حیزبی هەبێت پێویستە تەسلیمی ئەم بەڵگەنەویستانە و ئەم ڕاستییانە ببێت، باشە، ئەگەر شیوعی بەم ڕێگەیە گەیشتە دەسەڵات، ئەوانەی باوەڕیان بە فرە حیزبی هەیە ئایا خۆیان دادەبڕێنن لەمە یان تەسلیمی شیوعییەکان دەبن و حوکمەکەش ڕادەستی ئەوان دەکەن؟ بەدڵنیاییەوە حوکمەکەیان ڕادەست دەکەن؛ چونکە قانونێکی تریش هەیە دەڵێت "بنەمای دەستاودەست کردنی دەسەڵات بە ئاشتیانە"، وە واتای دەستاودەست کردنی دەسەڵات واتە حیزبی دەسەڵاتدار ئەگەر شکستی هێنا و کەسانێکی تر زۆرینەی دەنگیان بەدەستهێنا، لەسەر ئەم حیزبە پێویستە دەسەڵات ڕادەستی حیزبی براوە بکات، کە ئەمەش لە سیستەمی پەرلەمانی ناسراوە بە "بنەمای دەستاودەست کردنی دەسەڵات" واتە دەسەڵاتەکەت پێدەدەم بە ئاشتیانە و بە هەمان شێوە تۆش پێم دەدەیت بە ئاشتیانە.

ئایا لە سەرکردەکانیان هەیە کە مۆڵەت بدات بە شیوعییەکان حوکمی موسڵمانان بکەن؟ بەڵێ، دەزانی کێیە؟ ئەحمەد یاسین، ئەمەی دەیخوێنمەوە (أبو بصير الطرطوسي) باسی کردووە کە کەسێکی خراپە، پەڕتوکێکی هەیە بەناوی "حُكم الإسلام في الديمقراطية والتعددية الحزبية" لەم پەڕتوکەدا باسی گفتوگۆیەك دەکات کە کراوە لەگەڵ ئەحمەد یاسین، سەرۆکی حەماس ئەو کەسەی بزوتنەوەی حەماسی دامەزراند، وە ئەو قسەیەی باسی دەکات وەریگرتووە لە پەڕتوکێك بەناوی "أحمد ياسين،

الظاهرة المعجزة وأسطورة التحدي" لاپەڕە ١١٦ تاكو ١١٨، بەم شێوەیە (أبو بصير) دەیلێت لە پەڕتوكەكەی "حكم الإسلام في الديمقراطية والتعددية الحزبية" سەرنج بدە ئەو گفتوگۆیەی كراوە، ڕۆژنامەنووسەكە بە ئەحمەد یاسین دەڵێت: بەڵام گەلی فەڵەستینی دیموكراسییان دەوێت، بۆچی دژایەتیان دەكەن؟ ئەویش دەڵێت -واتە ئەحمەد یاسین-: وە منیش بە هەمان شێوە دیموكراسی فرە حیزبییم دەوێت، وە تیایدا دەسەڵات بۆ ئەو كەسە بێت كە براوە دەبێت لە هەڵبژاردنەكان" باشە، پرسیارێكی تر كە ئەم ڕۆژنامەنووسە لێی دەپرسێت: ئەگەر حیزبی شیوعی براوە بێت، هەڵوێستتان چۆن دەبێت؟ تۆ دەڵێیت ئازادییان بۆ هەیە، حیزبی شیوعی براوە بوو هەڵویستتان چۆن دەبێت، دەڵێت: "تەنانەت ئەگەر حیزبی شیوعی براوە بێت ئەوا من ڕێز دەگرم لە ویست و ئارەزووی گەلی فەڵەستینی" ڕۆژنامەنووسەكە پرسیارێكی تری لێدەكات دەڵێت: گەلی فەڵەستینی دەوڵەتێكی دیموكراسی فرە حیزبی دەوێت، جا ئەویش وەڵام دەداتەوە: "واللە ئێمە گەلێكین ڕێز و مافمان هەیە (كە ئەم قسەیەش ڕۆژنامەنووسەكە وا باسی كردووە كە ئەو بە توڕەییەوە وتویەتی) ئەگەر گەلی فەڵەستینی ڕەتكردنەوەی خۆی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی ڕابگەیەنێت ئەوا من ڕێزی ئارەزوو و ویستەكەی دەگرم و بە پیرۆزی دادەنێم" باشە، كەسانێك دەوڵەتی ئیسلامی ڕەت دەكەنەوە ئەی بە چی ڕازیین؟ بە شیوعیەت، دەڵێت: "ئەوا من ڕێزی ئارەزوو و ویستەكەی دەگرم و بە پیرۆزی دادەنێم".

بۆیە برایان بابەتەكە هەر تەنها بابەتی حیزبەكان نیە، بەڵكو پێویستە بزانیت چی دەكەوێتەوە لە باوەڕبوون بە فرە حیزبی، باشە.

جا ئەمە ڕاستییەكەیە، فرە حیزبی هەر كەسێك بگات ئەوا حوكم دەكات، وە لێرەدا پرسیارێك ئاڕاستەی مورجیئەی پیس دەكەین، وە بۆ هەر كەسێك لە موسڵمانان هەڵخەڵەتاوە بە حیزبی عێراقی: ئەگەر نەساڕا گەیشتنە حوكم -ئەوانەی كوفرەكەیان ئەسڵییە- بەپێی زۆرینە، یان ئێزیدی بەپێی زۆرینە گەیشتە حوكم و دەسەڵاتی گرتە دەست، سەرۆك لەوان بێت و سەرۆك وەزیران لەوان بێت و زۆرینەی وەزارەتەكان لە دەستی ئەوان بێت و دەوڵەتیش بەڕێوە ببەن بەگوێرەی بیروباوەڕەكەیان و بەرنامەكانیان، ئایا دەربارەی ئەوانەش بە هەمان شێوە دەڵێن گوێڕایەڵی كردنیان واجبە؟ وە بە هەمان شێوە دەڵێن (كفر دون كفر) ئەگەر بڵێی: بەڵێ، ئەوا هەڵگەڕاویتەوە لە دینی اللە عز وجل، وە ئەگەر بڵێی: نەخێر ئەوانە پێشەوا نین و گوێڕایەڵییان واجب نیە، پرسیارەكە دێتە پێش: كەواتە جیاوازی چییە لە نێوان "خُديدا" و "طولوس" و "ماركس" و "سليم الجبوري" جیاوازی چییە؟ هەموو ئەوەی ڕوویداوە ئەوەیە كە ناوەكان گۆڕاون، شوێنەكان هەمان شوێنن، وە وەزارەتەكان هەمان وەزارەتن و ئەركەكەش هەمان ئەركە، "بطرس" حوكمی دەكرد ئینجا "خديدا" هات، "خديدا" ڕۆیشت ئینجا "ماركس" هات، "ماركس" ڕۆیشت ئینجا

"سليم" هات ئیتر چی گۆڕا؟! ، جا ئەگەر وتت: ئەوەی حوکم بکات بەم قانونانە ئێستا ئەوا گوێڕایەڵی کردنیان واجبە و پێشەوا و سەرکردەی ئێمەن، کەوایە پێویستە لەسەرت دان بەمە بنێیت بۆ ئێزیدی و نەسڕانی و شیوعی؛ چونکە ئەوانە جیاواز نین لەوانی تر لە هیچ شتێکدا، هەموو ئەوەی گۆڕاوە تەنها ناوەکەیە! بۆچی شیوعی کە حوکم دەکات بە هەمان دەستور و بە هەمان قانون پێی ناڵێیت پێشەوا و گوێڕایەڵی کردنی واجبە، پاشان دێیتە سەر ئەوانی تر -هەمان قانون و هەمان دەستور و هەمان حوکم- پاشان دەڵێی گوێڕایەڵی کردنی واجبە و هەر کەسێکیش لێی دەربچێت ئەوا خاریجییە، وە کوفرەکەی ئەویش کوفری بچووکە، جیاوازییەکە لە کوێدایە؟ هیچ جیاوازیێك بوونی نیە

هەر کەسێك دانبنێت بەمە: نەسڕانی یان ئێزیدی یان شیوعی ئەگەر حوکم بکات و بوترێت ئەوانە پێشەوان و گوێڕایەڵییان واجبە و هەر کەسێکیش لێیان دەربچێت ئەوا لە خەواریجە، وە کوفری ئەوانیش کوفری بچووکە (كفر دون كفر)، کەوایە پێویستە لەسەرت هەمان حوکم بدەیت لەسەر ئەوانەی حوکمی وڵاتانی ئەوروپا دەکەن، لێرە "بطرس" حوکم دەکات و لەوێش "ئۆباما" حوکم دەکات، ئەمەیان قانونێکی دەستکردە و ئەوەی تریشیان قانونێکی دەستکردە، ئەگەر لەبارەی ئەو نەسڕانییە بەم سیفەتانەوە وتت: كفر دون كفر، کەوایە پێویستە لەبارەی ئەوانەش بڵێیت: كفر دون كفر، هیچ جیاوازی نیە لە نێوان ئەوانە و ئەوانی تر، بۆیە لەسەر موسڵمان پێویستە بزانێت مانای ئەو مورجیئانە چییە و مانای حیزبی عێراقی چییە و مانای بانگەوازکردن بۆ هەڵبژاردنەکان چییە؛ چونکە لە چوارچێوەی هەڵبژاردن پێویستە باوەڕیان بە فرە حیزبی هەبێت.

ئێستا ئەوانە -براکانم- لەم نموونەیە دەچن کە باسی دەکەم، دوای فەتحی مەککە -الله تعالى پیرۆز و گەورەی بکات- پێغەمبەر ﷺ (أسيد بن عتاب رضي الله عنه)ـی کردە ئەمیری مەککە کە لە تەمەنی هەژدەساڵیدا بوو، ئەمەش بۆیە باس دەکەم تاوەکو سەرت سوڕنەمێنێت کاتێك گەنجێك بکرێتە کاربەدەست، هەرچەندە (سهيل بن عمر) هەبوو، وە (أبو سفيان) هەبوو کە ئەوانە لە سەرکردەکانی مەککە بوون لە سەردەمی جاهیلی، بەڵام پێغەمبەر ﷺبە باشی زانی ئەرکەکە بسپێردرێت بەم گەنجە چونکە شایستە بوو بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە، دەگەڕێینەوە لای بابەتەکەمان، ئەگەر کۆمەڵێك لەنێو خەڵکی مەککە بێن و بڵێن: ئەی (أسيد)، الله عزّوجل ئایەتێکی دابەزاندووە دەربارەی ئێمە بەتایبەت بۆ ئێمەی خەڵکی مەککە دەفەرموێت (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ )[1] ، ئێمە دەمانەوێت بمێنینەوە لەسەر شیرکەکەمان، وە ئایەتێکی تر هەیە لە پەڕتوکەکەی ئێوە دەفەرموێت (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ) جا دەمانەوێت دینی خۆمان هەڵبژێرین، وە بەپێی ئەم ئایەتە تۆ ناتوانیت زۆرمان لێبکەیت لەسەر ئەوەی واز لە پەرستنەکانمان و

(١) الكافرون: ٦.

شیرکەکانمان بێنین، دەمانەوێت لەسەر دینەکەمان بمێنینەوە، پاشان پێویستە لەسەرت ڕێگەمان پێبدەی کە بانگەوازی کەسانی تر بکەین بۆ پەرستنی بتەکان، وە هەروەها بە ئاشکرا بت بوونی هەبێت لەناو مەککەدا و بتێك لێرە و خوایەك لێرە و خوایەك لەوێ، ئایەتەکان پابەندت دەکەن بەمە ئەی (أسید)، پاشان پێویستە لەسەرت ڕازی بیت لەسەر ئەوەی بەشداریت لەگەڵ بکەین لە حوکم -لە حوکمی مەککە- بەو پێیەی ئێمە بوونمان هەیە لە مەککە، ئێمە کۆمەڵەیەکین لە چوارچێوەی خەڵکی مەککە بۆیە پێویستە لەسەرت هەروەك چۆن تۆ حوکمی مەککە دەکەیت، ئێمەش بەم پێکهاتەیەوە حوکم بکەین، هەتاوەکو ڕازی بین لەسەر مانەوەمان لەسەر دینەکەمان (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) (لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ) کەواتە پێویستە لەسەرت بە هەمان شێوە منیش بکەیتە هاوبەش لە حوکم کردندا، وە لە بەرامبەر ئەمەشدا و بەهۆی بەشداری کردنم لەگەڵت؛ چونکە هەندێك حوکم لە دینەکەتان ئێمە پەسەندی دەکەین، ماڵی الله بە پیرۆز دادەنێین و تەواف دەکەین و (السّعي) دەکەین و ئەو پیرۆزیانەی لەناو مەککە هەن بە پیرۆزیان دەزانین، بەڵام پێویستە ئێوەش دان بنێن بە هەندێك لە پەرستشە تایبەتەکانمان، کەوا سائبە بکەین بۆ بتەکانمان و حام و وەصیلە و هاوشێوەی ئەمانە، وە مۆڵەتمان بدەن ئەگەر منداڵی لەدایکبوو مێینە بوو بینێژین چونکە ئەمە تایبەتە بە ئێمە، جیاوازی چییە لە نێوان ئەوەی وتم لەگەڵ واقیع و حاڵی ئەوانە؟

مەگەر مانای ئەو فرە حیزبییە ئەوە نیە کە نەسڕانی دینەکەی ڕابگەیەنێت لە ناوەوە هەروەك ئەگەر ڕێگە بدرایە بە موشریکەکانی مەککە لەو کاتەدا؟ هەروەها تەواوی ئەو حیزبانەی باسم کرد، جیاوازی نیە لە نێو دوو نموونەکە.

بابەتی کۆتایی کە ئاماژەی پێدەدەم: هەر کەسێك باوەڕی بە فرە حیزبی هەبێت واتە مۆڵەت بدات بە خەڵکی حیزب پێکبهێنن بەتایبەت ئەوانەی کوفرەکەیان کوفری ئەسڵییە، وەك نەساڕا بە کۆمەڵەکانیەوە، کلدانی تا ئاشوری تا سابیئی، تا هەموو ئەوانەی کوفرەکەیان کوفری ئەسڵییە، ناکۆك نین لەبارەی کوفرەکەیان، ئێزیدی ناکۆك نین لەبارەی کوفرەکەی، شیوعی و عەلمانی ئەوانە موڕتەدن، هەر کەسێك بڵێت باوەڕم بە فرە حیزبی هەیە وە بەپێی ئەو مافانە ئەمە واتە تۆ ئەوانە تەکفیر ناکەیت هەرچەندە بە زمانیش بڵێی من تەکفیریان دەکەم، بۆچی؟ چونکە ئەگەر تەکفیریان بکەیت ئەوا ناکرێت دانبنێیت بەم مافانە بۆیان، نابێت دان بنێیت بەوەی بیروباوەڕەکانیان بە ئاشکرا ڕابگەیەنن، نابێت دان بنێیت بۆیان کە بین بە خاوەنی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، نابێت دان بنێیت بۆیان کە بانگەواز بکەن بۆ بیروباوەڕیان لە ڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، نابێت دان بنێیت بۆیان کە بەشداری بکەن لە حوکمدا، نابێت دان بنێیت بۆیان بەوەی حوکم بکەن، بۆیە ئەگەر باوەڕت هەبوو بە فرە حیزبی ئەمە واتە تۆ تەکفیریان ناکەیت،

ئەگەرنا ئەگەر تەکفیریان بکەیت ئەوا پێویستە لەسەرت دان نەنێیت بە هیچ مافێك لەو مافانە بۆیان، بەڵگەی ئەمەش ئەم فەرموودەیەی الله تعالی ـیە ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ﴾(١)، ئەمە دینەکەمانە، وە باوەڕبوون بە فرە حیزبی ئەمە دەستورەکەیانە، ئێستا ئەوان کار دەکەن بە دینەکەیان یان کار دەکەن بە دەستورەکەیان؟ بەدڵنیاییەوە کار دەکات بە دەستورەکەی جا ئەو تەکفیری دەکات لە دیندا -دەڵێت ئەوانە کافرن، ئەمە لە ئیسلام- بەڵام کاتێك دێت و پابەند دەبێت بە دەستور ئەوا مۆڵەت دەدات بەوانە بۆ بیروباوەڕەکە و مۆڵەت دەدات بە ڕاگەیاندن و بانگەواز و مۆڵەت دەدات بە بەشداری کردنەکە و مۆڵەت دەدات بە حوکم کردنیش، کەواتە چۆن ئەم دوو دینە دەگونجێنی؟ دینێك پێت دەڵێت: بانگیان بکە بۆ ئیسلام جا ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە ئەوا پێویستە سەرانە بدەن، وە هەندێکیان سەرپشك دەکرێن لە نێوان ئیسلام و کوشتندا، ئەمە دینەکەمانە، بەڵام ئەوەی کاری پێدەکەن دەڵێت: دروستە بۆ ئەوانە حیزبەکان پێکبهێنن بەپێی دەقی ماددەی ٣٧ لە دەستوری عێراقی، کەوایە تۆ ئێستا دوو دینی دژیەك کۆ دەکەیتەوە، دینێك دان نانێت بە هیچ یەکێك لەو دینەی لەسەریەتی، وە ئەگەریش دان بنێت بە خاوەن پەڕتوکەکان ئەوا بە ڕێکخەرە شەرعییەکانە نەك ئەوەی کە ئازاد بێت لە بانگەوازکردن بۆ بیروباوەڕەکەی، لە ئیسلامدا -پێشتر باسم کرد بۆتان- ئەو نابێت هیچ شتێك بە ئاشکرا دەربخات لە بیروباوەڕەکەی و لە دینەکەی و نابێت هیچ شتێك دەربخات لە دروشم و ڕێوڕەسمەکانی، ئەمە دینەکەمانە، بەڵام لە دەستوردا بۆی هەیە هەموو ئەوانە ڕابگەیەنێت و دەربخات، بۆیە تۆ ئێستا دەتەوێت دوو دینی دژیەك کۆ بکەیتەوە، ناکرێت ئیسلام کۆ بکەیتەوە لەگەڵ ئەم باوەڕە [فرە حیزبی] ناکرێت، جا ئەگەر ئیسلامت تێکەڵ کرد بەم بیروباوەڕە -بیروباوەڕی باوەڕبوون بە فرە حیزبی- ئەوا شتێکت بۆ نامێنێتەوە بەناوی ئیسلام، ﴿وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا﴾(٢)، بۆیە ئەوانە هەرچەندە بڵێن ئێمە بە کافریان دەزانین، بەڵام دەستورەکەیان تەکفیریان ناکات، ئەگەر تەکفیری بکردنایە دانی نەدەنا بەو مافانە بۆیان و ڕێگەی پێنەدەدان حیزب دروست بکەن لەناو وڵاتانی موسڵمانان.

شتێکی تر، تۆ دەزانیت کە ئەو کەسەی تەکفیری کافری ئەسڵی نەکات ئەوا کوفری کردووە چونکە ئایەتە قورئانییەکان بەدرۆ دادەنێت، هەروەها ئەو هەڵوەشێنەرەوەیەی شێخ محمد بن عبد الوهاب -رحمه الله- باسی کردووە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دەڵێت: "ئەوەی تەکفیری موشریکەکان نەکات

(١) الممتحنة: ٤.

(٢) النساء: ١٥٠- ١٥١.

یان گومانی هەبێت لە کوفرەکەیان یان بیروباوەڕەکەیان بە چاك بزانێت ئەوا کوفری کردووە" ئەگەر تەکفیریان نەکەیت کوفرت کردووە؛ چونکە الله عزّ وجل تەکفیری کردوون بۆیە ئەوەی تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە الله تعالی تەکفیری کردووە ئەوا هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە لە ئیسلام، هەروەها باوەڕبوون بە فرە حیزبی دژیەکە لەگەڵ پێناسەی ئیسلام، وە پێناسەی ئیسلام هەروەك دەزانیت "تەسلیم بوونە بە الله بەهۆی یەکخواپەرستی و ملکەچ بوون بۆی بە گوێڕایەڵی کردن و بەرائەت کردن لە شیرك و ئەهلەکەی" ئەمە پێناسەی ئیسلامە، جا هەر کەسێك ئەم سێ بەشە لە پێناسەکە بەجێ بهێنێت ئەوا موسڵمانە، جا ئایا بەڕائەت لە شیرك لە کوێیە لەبارەی ئەو کەسەی باوەڕی هەبێت بە فرە حیزبی؟ وە بەڕائەتەکە لە خواکانیان و لە پەرستراوەکانیان لە کوێیە؟ بۆیە پاڵێوراوەکان، ئەو حیزبانەی بەشداری دەکەن لە وڵاتانی دیموکراسی لە هەڵبژاردنەکان و دەچنە پەرلەمانەکان ئەوا لەم جێگەیەدا لە دین دەردەچن، ئەمەش جێگەی دووەم بوو.

دێینە سەر جێگەی سێیەم، ئەو حیزبانە بەدڵنیاییەوە دەزانن ئەوان کاتێك دەچنە نێو هەڵبژاردنەکان، وە تاکەکانیان دەپاڵێون بۆ چوونە نێو حکومەتە تاغوتییەکان، هەموو دەزانن کە ئەو تاکانە سوێندی دەستوری دەخۆن، دەقی سوێندی دەستوری لە قانونی عێڕاقییت بۆ دەخوێنمەوە، سەرنج بدە، ماددەی ٤٨ لە دەستوری عێڕاقی دەڵێت: "ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران سوێندی دەستوری دەخوات لەبەردەم ئەنجومەنەکە پێش ئەوەی بچێتە نێو کارەکەی بەم شێوەیە -پێش ئەوەی هەر شتێك وەربگرێت سوێند دەخوات، سەرنجی شێوەکە بدە- دەڵێت: سوێند دەخۆم بە خوای بەرز و گەورە کە ئەرك و بەرپرسیاریەتییە قانونییەکانم جێبەجێ بکەم بە کۆشش کردن و دڵسۆزییەوە، وە پارێزگاری بکەم لە سەربەخۆیی عێڕاق و سەروەرییەکەی و بەرژەوەندییەکانی گەلەکەی ڕەچاو بکەم و شەونخونی بکەم لە پێناو سەلامەتی خاکەکەی و ئاسمانەکەی و ئاوەکەی و بەروبوومەکانی و سیستەمە دیموکراسییە فیدڕاڵییەکەی، وە کار بکەم لەسەر پاراستنی ئازادییە گشتی و تایبەتییەکان و سەربەخۆیی بڕیاردان (القضاء) -سەرنج بدە- وە پابەند ببم بە جێبەجێکردنی تەشریعەکان بە ئەمانەت و بێ لایەنی، وە الله شایەدە لەسەر ئەوەی دەیڵێم" دەستی لە کوێ دادەنێت کاتێك ئەم سوێندە دەڵێتەوە؟ لەسەر پەڕتوکی الله عزّ وجل، سوێند دەخوات بە الله تعالی و دەیکات بە شایەد لەسەر ئەوەی کار نەکات بە پەڕتوکی الله عزّ وجل!

یەکێك لە قوتابیەکان دەڵێت: واتە سوێند دەخوات بە الله لەسەر ئەوەی سەرپێچی فەرمانی الله بکات، شێخ دەڵێت: ئەگەر تەنها سەرپێچی و گوناهێك بوایە ئەوا بابەتەکە سادە و ئاسان دەبوو، بیر لەوە بکەوە کە (إبراهیم نعمة) ئەم سوێندەی خواردووە! باشە، مانای ئەم سوێندە چییە گەنجەکان؟

یەکەم شت دەڵێت: "سوێند دەخۆم بە خوای بەرز و گەورە کە ئەرك و بەرپرسیاریەتییە قانونیەکانم جێبەجێ بکەم" واتە کاتێك شتێك وەردەگرم و ئەم شتەش پەیوەستە بە قانون و دەستور سوێند دەخۆم بە الله کە پابەند ببم بە قانون و دەستور لە هەر جێگەیەك کە دامدەنێن، دەڵێت: "بە کۆشش کردن و دڵسۆزییەوە" چونکە کردەوە وەرناگیرێت هەروەك دەزانن مەگەر ئیخلاص و دڵسۆزی تیادا بێت!، وە ئەوانەش بەدەق دایانناوە لەسەر دڵسۆزی لە کارکردن لەسەر ئەوەی پابەند ببێت بە دەستور بە کۆشش کردن و بە دڵسۆزییەوە.

پەڵپێکی تر دەڵێت: پارێزگاری دەکەم لە سەربەخۆیی عێراق و سەروەرییەکەی، واتە "سایکس بیکۆ" ئێستا الله عزّ وجل بەهرەمەندی کردین و سنووری نێوان سوریا و عێراق لابرا، ئایا دەزانی ئەوانەی ئەو سوێندە دەخۆن ئێستا کار دەکەن لەسەر گەڕاندنەوەی بەربەستەکە سەر لەنوێ؟ چونکە سوێندیان خواردووە لەسەر ئەوەی پارێزگاری بکەن لە سەروەری عێراق و خاکەکەی و عێراقییش سنوورە ناسراوەکەی بەگوێرەی دابەشکردنی سایکس بیکۆ، باشە.

شتێکی تر، دەڵێت "وە سوێند دەخۆم بە خوای گەورە بە هەمان شێوە پارێزگاری بکەم لە سیستەمە دیموکراسییە فیدراڵییەکەی -واتە هەر سیستەمێکی تر بێت قبوڵی ناکات وە شتێکی تر- وە پابەند بم بە جێبەجێکردنی تەشریعەکان بە ئەمانەتەوە" ئەو تەشریعانە چیین؟ واتە ئەوانەی کە ئەندامانی پەرلەمان دایاندەنێن؛ چونکە ئەوانە لە ئایندەدا تەشریع دادەنێن، تەنها ئەوانە دەبێت کە لە دەستور هەیە کاتێك سوێند دەخوات، هەندێك لە تەشریعەکان بوونیان نیە لە دەستور بەڵام ئەندامانی ئەنجومەنی تەشریعی -پەرلەمان- کاتێك دەستورێك دادەنێن سوێند دەخوات لەسەر ئەوەی گوێڕایەڵی ئەو تەشریعانەش دەکات کە کۆمەڵی ئەنجومەنی تەشریعی یاخود دەسەڵاتی تەشریعی دایدەنێن کە ئەوانیش ئەندامانی پەرلەمانن پاشانیش دوای ئەوە "والله علی ما أقول شهید".

ئەم قسەیە ئەوەی پێشتر وتمان پشتڕاست دەکاتەوە، مەگەر ئەمە حەڵاڵ کردن نیە بە سوێند خواردن لەسەر حوکم کردن بە دەستور؟ ئەم سوێندە لە لای گوێگر هەر تەنها ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوانە حەڵاڵ دەکەن بەڵکو جەخت دەکەنەوە لەسەر حەڵاڵ کردنەکە بە سوێند خواردن! بۆیە ئەمە خودی حەڵاڵ کردنە.

ئیخوانی میصر و هەروەها حیزبی عێراقی ئەوانە بەهۆی خۆدانە پاڵیان بۆ ئیسلام کاتێك پێیان دەوترێت چۆن ئەم سوێندانە دەخۆن و پەیڕەوی لێدەکەن؟ بە دوو فێڵ دێنە پێش؛ چونکە کابرا دەستی گرتووە بە دیموکراسی، دەکرێت ئیسلام تەئویل بکات بەو شتەی یەکدەگرێتەوە لەگەڵ دیموکراسی، بەڵام ناکرێت زیان بگەیەنێت بە دیموکراسی بە هەر بارێك لە بارەکان، جا کاتێك ڕووبەڕووی ئەم شتە دەبنەوە، چۆن

سوێند دەخۆی کە کار بکەیت بەم دەستورە و تەشریعەکان بە کۆشش و دڵسۆزییەوە و پارێزگاریان لێبکەیت؟ دەڵێن: من کاتێك دەستم لەسەر پەڕتوکی الله عزّ وجل دادەنێم و سوێند دەخۆم لەسەر کارکردن بە قانون و تەشریعەکان من نیەتم شەریعەتی الله ـیە عزّ وجل نەك ئەم قانون و دەستورانە، ئەمە فڕوفێڵی کەسانێکە کە خوویان گرتووە بە فریودانی مسوڵمانان، بەهۆی ئەوەی خاوەن مینبەرن، بەهۆی ئەوەی گوایە زانان، بەهۆی ئەوەی وتاریان هەیە، بەهۆی ئەوەی وانەیان هەیە، بەهۆی ئەوەی خەڵك پرسیاریان لێدەکەن، بەهۆی و بەهۆی ..، من پیاوێکی مسوڵمانم لەمە نازانم کاتێك کەسێك بەم سیفەتانە پێم دەڵێت: من بەم شێوەیە سوێندم خواردووە، کە جێی متمانەیە لە لام و شتێك لە زانستیش نازانم کە وتەکەی ئەو بەدرۆ بخەمەوە، باشە، ئایا خۆم تەسلیمیان بکەم بۆ ئەم فێڵەی کە مسوڵمانانیان پێهەڵخەڵەتاندووە؟

فەرموودەیەك هەیە (أبو هريرة (رضي الله عنه)) گێڕاویەتیەوە و لە لای ئیمامی موسلیم -رحمه الله- هاتووە دەڵێت: رسول الله (ﷺ)فەرمووی: "اليمين على نيَّة المُستَحلِف" واتە: سوێند خواردن بەگوێرەی نیەتی ئەو کەسەیە کە داوای سوێندەکە دەکات. (حالف) هەیە کە ئەو کەسەیە سوێندەکە دەخوات، وە (مُستَحلِف) ئەو کەسەیە داوای سوێند خواردنەکەت لێدەکات، ئەو کەسانە بەپێی ئەم فەرموودەیە ئایا سوێندیان خواردووە لەسەر نیەتەکانیان یان سوێندیان خواردووە لەسەر ئەوەی هاتووە لە دەستور؟ (قوتابییەکان وەڵام دەدەنەوە) : لەسەر ئەوەی هاتووە لە دەستور.

شێخ دەڵێت: دەستور؛ چونکە خاوەنی دەستور داوا لەوان دەکات ئەم سوێندە بخۆن و کاتێکیش دەڵێت من پابەند دەبم بە قانون و تەشریعەکان بە کۆشش کردن و دڵسۆزییەوە، خاوەنی ئەم قانونە مەبەستی دەستورە و مەبەستی قانونە، کەواتە ئەو کەسەی سوێند دەخوات ئەوا سوێند دەخوات لەسەر نیەتی ئەو کەسەی ئەم ماددەیەی داناوە لە دەستوری عێراقی نەك لەسەر نیەتی تۆ، ئەگینا ئەگەر سوێند بخۆم لەسەر نیەتم ئەوا زۆرێك لە مافەکان بە زایە دەچێت! داوای شتێکم لێدەکەیت دەڵێیت: ئەم ئامێرە هی منە، دەڵێم: سوێند بە الله ئەم ئامێرە هی تۆ نیە -لە کاتێکدا دەزانم ئامێرەکە هی تۆیە- بەڵام لە نیەتمدا چی هەیە؟ من مەبەستم ئەم پەرداخەیە، کەوایە ئامێرەکەت لەدەست چوو!، بۆیە ئەگەر سوێند لەسەر نیەتی سوێندخۆر بوایە ئەوا زۆرێك لە مافەکان بە زایە و بەهەدەر دەچوو هەر بۆیەش پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "اليمين على نيّة المُستَحلِف" جا ئەگەر بتەوێت فێڵمان لێبکەیت و بڵێی من مەبەستم شەریعەتە، وە تۆ دەزانیت درۆ دەکەیت پێش کەسانی تر -نەك تەنها لەبەر فەرموودەکە- بەڵکو دەزانیت بەدڵنیاییەوە کە درۆ دەکەیت؛ چونکە کاتێك چوویتە نێو ئەو بازنەیەوە ناکرێت حوکم بکەیت بە شەرعی الله عزّ وجل، بەڵکو بەدڵنیاییەوە دەزانیت تۆ حوکم دەکەیت بە دەستور، ئینجا چۆن دەڵێی: نیەتم

شەریعەتی الله ـیە -عزّ وجل-! ئەو سوێندەی خۆتت پێوە پابەند کرد، کاتێك دەچیتە نێو پەرلەمان حوکم دەکەیت بە پەڕتوکی الله و شەریعەتی الله یان حوکم دەکەیت بە دەستور؟! کەوایە کوا سوێندەکەت! ئەمەش دەرچەیەکە کە ئەوانە دەیانەوێت خۆیانی لێدەرباز بکەن لەژێر حوکمەکانی ئەم سوێندە.

ئیخوانی میصر، کە هەمیشە شەیتان لە دەرگاکان بۆیان دەکاتەوە پەنا بە الله ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ﴾(١) ، کاتێك گەیشتن بەم سوێندە جیاکردنەوەیەکیان بۆ زیاد کرد: سوێند دەخۆم بە الله کە کار بکەم بە قانون و تەشریعەکان و پارێزگاری بکەم..، دەڵێت: هەتاوەکو سەرپێچی و گوناهی تێدا نەبێت، یاخود هەتاوەکو پێچەوانەی شەرع نەبێت!

براکانم ئەمە بۆ فڕوفێڵە، موڕسی بوو بە سەرۆکی دەوڵەت سوودی ئەم قسەیەی چییە: هەتاوەکو پێچەوانەی شەرعی الله نەبێت؟ سوودی ئەم قسەیەی چییە: هەتاوەکو فەرمانم پێنەکات بە گوناه و تاوان؟ مەگەر قانونی میصری ڕێگە نادات بە کارکردن بە ڕیبا؟ کاتێك ئەو چوار ملیار و نیوی لە بانکی نێودەوڵەتی قەرز کرد ئەو لە کوێی ئەمە بوو "لەسەر ئەوەی سەرپێچی شەرعی الله نەکەم، ئەگەر فەرمانم پێنەکات بە سەرپێچی و گوناه"! بۆیە ئەمە فێڵێکە تەنها بۆ ئەوەی پاکانەی بەردەوامبوونیان بکەن لە ڕێکردن بەدوای ئەفلاتون و کارکردن بە دیموکراسی و ڕازیکردنی ئۆباما، هیچی تر نیە،

باشە، کەسێك ئەم سوێندەی خوارد، چی بۆ دەمێنێتەوە لە ئیسلام؟ وە هەروەها لەو شتانەی درۆی ئەوانە دەسەلمێنێت – کە من مەبەستم: هەتاوەکو فەرمانم پێنەکات بە سەرپێچی و گوناه، هەتاوەکو و هەتاوەکو.. ، ئایا دەزانی ئەرکی ئەندامانی پەرلەمان چییە لە عێراق و هەروەها لە تەواوی پەرلەمانەکان؟ ماددەی ٥٨ لە دەستوری عێراقی: " لەسەر ئەوەی ئەرکەکانی نوێنەران بریتییە لە: یەکەم: دانانی قانونەکان، دووەم: چاودێری کردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن" ئەمە ئەرکیانە، چاودێری کردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن، بۆیە تۆ کاتێك دەچیتە ناویەوە ئەوا تەشریعەکان دادەنێی و چاودێری هەموو وەزیرێك دەکەی ئەگەر سەرپێچی دەستور بکات ئەوا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکەی، کەوایە کوا حوکم کردن بەوەی الله دایبەزاندووە؟ وە سوێندم خوارد لەسەر ئەوەی من حوکم دەکەم بە شەریعەتی الله، وە کوانێ ئەم وتەیەیان "هەتاوەکو فەرمانم پێنەکات بە سەرپێچی و گوناه" و ئەم وتەیەشیان مادام دەقێك نەهاتبێت و هاوشێوەی ئەمانە؟ بۆیە ئەمە تەنها فێڵێکە کە بەهۆیەوە فێڵیان لە مسوڵمانان دەکرد بەدرێژایی ئەو ماوەیە.

بەمە کۆتایی دێنین، والحمد لله وصلَّى الله على محمد وعلى آله وصحبه.

---

(١)الأنعام: ١٢١ .

